


زنجیره وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## منفذوا الدستور

## جێبەجێكەرانی دەستور

وتاری شیخ

تقبله الله

أبو علي الأنباري

وەرگێڕان و ئامادەكردنی

پێگەی ڕاستەڕێ




پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (هەشتەم)

بەناونیشانی
# جێبەجێکەرانی دەستور

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشیمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودبەخشمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە حوججە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت.

لە فەزڵ و بەخششی الله تەواو بووین لە بەشی یەکەم لە بابەتەکەمان کاتێك قسەمان کرد لەبارەی شیرکی گوێڕایەڵی کردن بە پێناسەکردن و ناوەڕۆکیەوە -ولله الفضل والمنة- پاشان دوای ئەوە قسە دەربارەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور بوو، وە باسی هەندێك ڕاستییمان کرد دەربارەی ئەم لیژنەیە ئەوەی کە ئەوان کۆمەڵە هاوبەشێکن ئەوان کۆمەڵە پەرستراوێکن ئەوان کۆمەڵە هاوەڵێکن ئەوان موعەقیبن (هەڵوەشێنەر و پەکخەر و ڕەتکەرەوەن)، وە ئەوان دۆستانی شەیتانن، پاشان لە فەزڵ و بەخششی الله باسەکە دەربارەی دەستور بوون، وتمان کە حوکمانێکی جاهیلییە و هەروەها لە ئارەزوو و هەوەسی جوولەکە و نەساڕایە، وە وتیشمان ئەم دەستورانە دینە، ئەمە بەشی سێیەم بوو لە بابەتەکە، بەشی کۆتایی لە بابەتەکە دەربارەی جێبەجێکەرانی دەستور دەبێت، ئەم دەستورە کێ حوکمی پێ دەکات؟ حەقیقەتی ئەوانە چییە و حوکمی شەرع چییە لەبارەیانەوە؟

پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم: مەبەست لە جێبەجێکەرانی قانونەکان و دەستورەکان ئەو حکومەتانەن کە حوکم دەکەن بەم قانونانە بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە، هەروەك دەزانن ئەو حکومەتانەش سێ پێکهاتەیان هەیە: دەسەڵاتی جێبەجێکردن، دەسەڵاتی تەشریعی، دەسەڵاتی بڕیاردان، ئەمانە سێ دەسەڵات بوون لەم حکومەتانە، مەبەست لە دەسەڵاتی تەشریعی: بریتیین لە ئەندامانی پەرلەمان، ئەوانە دەسەڵاتی ئەوەیان پێدراوە تەشریع دابنێن بۆ پێشهات و ڕووداوە نوێیەکان لە ماوەی دەسەڵاتیان یان خولی دەسەڵاتەکەیان کە چوار ساڵە لە عێراق و لە تورکیا حەوت ساڵە و لە جەزائیر پێنجە و لە هەندێك وڵاتەکان زۆربەی وڵاتەکان چوار ساڵە، کەوایە حکومەتەکان پێکهاتوون لە دەسەڵاتی تەشریعی کە بریتیین لە ئەندامانی پەرلەمان، وە دەسەڵاتی جێبەجێکردن و ئەم دەسەڵاتەش وەزیرەکان و بریکارەکانیان و بەڕێوەبەرە کارگوزارەکانیان دەگرێتەوە و هەموو ئەم پێکهاتەیەش هەر هەمووی دەچێتە چوارچێوەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن، سەرۆك وەزیران و سەرۆکی کۆماری، هەموو ئەوانە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە قەڵەم دەدرێن، دەسەڵاتی سێیەم هەیە کە ئەویش دەسەڵاتی بڕیاردانە و مەبەستیش لێی دەسەڵاتی حوکم دان و پاشکۆیەکانی حوکم دانە پیشەی پارێزەری و

هاوشێوەی ئەمانە، کەوایە پێکهێنانی حکومەت لەسەر ئەم سێ دەسەڵاتە دامەزراوە، جا قسەم دەربارەی ئەوانە دەبێت بەم پێکهاتەیە، ناوی شەرعی بۆ ئەم حکومەتانە ئەوەیە کە پێی دەوترێت حکومەتە تاغوتییەکان، چۆن دەیسەلمێنیت کە ئەم حکومەتانەی بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە حوکم دەکەن حکومەتی تاغوتیین؟ لە ڕووی زمانەوانیەوە ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ فەرهەنگەکان دەبینی کە ناوی "طاغوت" لە فیعلی "طغى" هاتووە و مانای طغى واتە: سنوور تێپەڕاندن و بەزاندن، هەر شتێك جا یەکسانە ئینسان بێت یان ئاژەڵ یان هەر دروستکراوێك لە دروستکراوەکانی الله عز وجل، ئەگەر ئەو سنوورە بڕیاردراوەی بۆی دانراوە بەزاندی و تێپەڕی کرد پێی دەوترێت تاغوت، بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله تعالى ئەم فەرموودەیەیەتی -عز وجل- ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ ۝١١﴾[1]، واتە: بەڕاستی ئێمە کاتێك ئاو لە سنوور دەرچوو (لە کاتی تۆفانەکەی نوح دا) ئێوەمان لە کەشتیدا هەڵگرت (باو وباپیرانی ئێوە).

کەوایە لێرەدا ئاو بووە تاغوت، چۆن ئاو بوو بە تاغوت؟! چونکە ئەو بوارەی تێپەڕاند کە الله عز وجل بۆی داناوە، ڕووباری فوڕات و ڕووباری دیجلە ڕێژەیەکی دیاریکراویان هەیە، بەڵام کاتێك ئەم سنوورە دەبەزێنێت ئەمە پێی دەوترێت (طغیان)، بۆیە ئاو دەکرێت پێی بوترێت تاغوت، ئەمە لە ڕووی زمانەوانیەوە، جا ئەگەر بێینە سەر ئەم حکومەتانە لە ڕووی زمانەوانیەوە دەبینین کە حوکمەکانی الله عز وجل ـیان بەزاندووە و هەندێك حوکمی جێگرەوەیان هێناوە، بۆیە لە ڕووی زمانەوانیەوە ماناکە بەدیهاتووە لەم حکومەتانە بەوەی ئەوان حوکمەکانی الله عز وجل ـیان بەزاندووە بۆ قانونەکان و بۆ دەستورەکان، ئەمە لە ڕووی زمانەوانیەوە، بەڵام لە ڕووی شەرعییەوە، ئیبن قەییم -رحمه الله- لە پێناسەی تاغوتدا دەڵێت: هەر شتێك بەهۆیەوە بەندە سنووری خۆی ببەزێنێت لە پەرستراو یان شوێنکەوتوو یان گوێڕایەڵیکراو، وە تاغوتی هەموو گەلێك ئەوەیە کە حوکم دەبەنەوە بۆ لای جگە لە الله و پێغەمبەرەکەی" ئەمە پێناسەی تاغوتە لە لای ئیبن قەییم -رحمه الله-، لە لای ئیبن ئەبی حاتەم -رحمه الله- وتەیەکی نەقڵ کردووە لە موجاهید ـەوە -رحمه الله- دەڵێت: "تاغوت شەیتانێکە لە شێوەی ئینسان، حوکم دەبەنەوە بۆ لای کە ئەویش کاربەدەستیانە و کاروبارەکانیان بەڕێوە دەبات" ئەمە لە لای موجاهید، وە لە لای ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەس -رحمه الله- هەروەك ئیمامی قوڕتوبی -رحمه الله- لەویەوە نەقڵی کردووە وتویەتی: "تاغوت بریتییە لە شەیتان یان ساحیر یان کاهین ئەوانە هەموویان بە تاغوت هەژمار دەکرێن"، کەوایە دەشێت تاغوت ئینسانێك بێت یاخود دەشێت تاغوت جگە لە ئینسان بێت، هەتا ئەو سنووری بڕیاردراو بۆی ببەزێنێت و تێپەڕێنێت ئەوا ناوی شەرعی و بە هەمان شێوە لە ڕووی زمانەوانیشەوە تاغوتە، ئەمە وتەکانی زانایانە بەڵام ئەی بەڵگە چییە لە پەڕتوکی الله عز وجل لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی حوکم دەکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە پێی دەوترێت تاغوت،

---

(١) الحاقة: ١١

ئایەتەکە لە سوڕەتی (النساء)ـە الله تعالی دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ۝٦٠﴾، واتە: ئایا نەتڕوانیووەتە ئەوانەی لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران) کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە لای تاغوت تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لە کاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە بێباوەڕ ببن پێی (تاغوت)، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور و بێ سنوور.

چۆن ئەم ئایەتە بە بەڵگە دەهێنیتەوە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی حوکم بە غەیری ئەوە دەکات کە الله دایبەزاندووە پێی دەوترێت تاغوت؟ سەرەتا پێویستە ئاماژە بدەین بە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە، (ابن العربي -رحمه الله-) لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبن عەباس ـەوە (ﷺ)گێڕاویەتیەوە و باسی کردووە کە ناکۆکی و کێشەیەك دروست بوو لە نێوان مونافیقێك و جوولەکەیەك لە سەردەمی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- (ﷺ)و ویستیان حوکم بکرێت لە نێوانیان جا جوولەکەکە ویستی حوکم بباتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)بەڵام مونافیقەکە دەیویست حوکم بباتەوە بۆ لای کەعبی کوڕی ئەشرەف، ئینجا الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ) ئەمە لە لای(ابن العربي -رحمه الله-)،هەروەها لە لای(الواحدي-رحمه الله-)یش لە (أسباب النزول) هەمان گێڕانەوەی باسکردووە بەڵام گۆڕانکارییەکە لە ناوەکەدایە جا دەڵێت: جوولەکەکە ویستی حوکم بباتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)و مونافیقەکەش ویستی حوکم بباتەوە بۆ لای ئەبی بوردەی ئەسلەمی، کەوایە لە هەندێك ڕیوایەت دەڵێت مونافیقەکە ویستی حوکم بباتەوە بۆ لای کەعبی کوڕی ئەشرەف و لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت ویستی حوکمم بباتەوە بۆ لای ئەبی بوردەی ئەسلەمی کە جیاوازی نیە ئەو بێت یان ئەوی تر ئەم باسە زۆر گرنگ نیە بۆمان، بەڵگە هێنانەوەکە لە کوێدایە؟ لەم فەرموودەیەیەتی -تبارك وتعالى- (يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا) هەروەك دەزانن کە حوکم بردنەوە نابرێتەوە بۆ لای کەس تەنها بۆ ئەو کەسەی حوکم دەدات چونکە ئەوەی حوکم نادات خەڵك حوکم نابەنەوە بۆ لای، هەر بۆیەش مونافیقەکە کەعبی کوڕی ئەشرەف یاخود ئەبی بوردەی ئەسلەمی هەڵبژارد یەکێك لەم دوو ناوە، ویستی کێشە و ناکۆکیەکە بباتەوە بۆ لای ئەو، بەدڵنیاییەوە ئەمە حوکمی دەردەکرد بۆیە مونافیقەکە ویستویەتی حوکم بباتەوە بۆ لای، لایەنی باسەکە لە ئایەتەکە لە کوێیە؟ ئێمە زانیمان کە ئەو کەسەی مونافیقەکە ویستی حوکم بباتەوە بۆ لای جا کەعبی کوڕی ئەشرەف بێت یان ئەبو بوردەی ئەسلەمی، بۆچی الله عز وجل باسی نەکردوون بە ناو؟ بۆچی نەیفەرموو – الم تر الى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل اليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى كعب بن الأشرف – هەروەك

فەرموویەتی ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾[1] کەوایە ناوەکان باسکراون ئەی بۆچی الله عز وجل ئەم ناوەی باسنەکردووە یاخود ناوی ئەو کەسەی ویستیان حوکم ببەنەوە بۆ لای و ناوێکی تری باسکردووە و فەرمووی (يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ)، چونکە کەعبی کوڕی ئەشرەف حوکمی دەدا بەوەی لە دینەکەی بوو -جوولەکە بوو-، وە ئەبو بوردەی ئەسلەمی حوکمی بە غەیری ئەوە دەکرد کە الله عز وجل دایبەزاندبوو، بۆیە ئەوانەی حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە کاتێك حوکم دەبرێتەوە بۆ لایان، ئەوا ناوی شەرعی بۆیان ئەوەیە کە تاغوتن، وە الله تعالی -هەروەك دەزانن- کاتێك ئەم دینە پیرۆزەی کردە دوایین دین، حوکمانێکی داناوە گونجاوە بۆ هەموو ڕۆژگارێك و بۆ هەموو شوێنێك، بۆیە ئەگەر بیفەرموبایە دەیانەوێت حوکم ببەنەوە بۆ لای کەعبی کوڕی ئەشرەف ئیتر ئایەتەکە تایبەت دەبوو بەم ناوە، دوای ئەوە دروست نەدەبوو ناوێکی تر دابنێین لەگەڵ کەعبی کوڕی ئەشرەف، بەڵام ناوێکی هێناوە دەشێت بۆ کەعب دەشێت بۆ هەر کەسێك کە وەك کەعب ـە تاوەکو هەڵسانی قیامەت، جا هەر کەسێك حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە پێی دەوترێت تاغوت لە پەڕتوکی پەروەردگارمان، کەواتە شوێنی بەڵگەهێنانەوەکە لێرەدا بوو لە فەرموودەی الله تعالی (يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ).

تێبینییەکی گرنگ هەیە کە ئاماژەی پێدەدەم، کاتێك دڵنیابووینەوە لەوەی الله عز وجل باسی ئەوانەی نەکردووە بە ناو کە حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە بەڵکو بە ناوێك باسی کردوون دەگونجێت بۆ هەموو ڕۆژگار و شوێنێك "تاغوت"، لە بیرمەکە کە ئەمە هەڵبژاردنی الله ـیە -عز وجل-، ئەم ناوە الله تعالی بە ڕێگەی وەحی هەڵیبژاردووە لە قورئاندا، بۆیە هەر کەسێك لە کەعبی کوڕی ئەشرەف بچێت یاخود ئەبو بوردەی ئەسلەمی ئەوا پێی دەوترێت تاغوت، وە هەر کەسێکیش بە جگە لەم ناوە ناویان بنێت ئەوا سەرپێچی ناولێنانەکەی الله عز وجل ـی کردووە لە قورئاندا، جا ئەگەر یەکێك وتی هەروەك مورجیئەی سەردەم وا دەڵێن پەنا بە الله -وە ئەوانە ناویان دەنێین مورجیئە لە ڕووی پێناساندنەوە ئەگەرنا حاڵیان خراپترە لە (الكرامية) ئەوانەی لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسی هەبوون- (لە ڕووی پێناساندنەوە) مورجیئە دەربارەی ئەو دەسەڵاتدارانە ئەوانەی حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، پێیان دەڵێن پێشەوا و گوێڕایەڵیشیان واجبە، ئەوانە هەر هەموویان بەبێ جیاکردنەوە، ئەوەی لەگەڵ جوولەکەیە و ئەوەی لەگەڵ نەساڕایە و ئەوەی هەڵگەڕاوەتەوە لە دینی الله و ئەوەی هەر چییەکی کردووە و هەر چۆنێکی کردووە، دەڵێت ئەو پێشەوا و سەرکردەیە و گوێڕایەڵی کردنیشی واجبە! بەپێی عەقیدە پوچەڵەکەیان؛ چونکە عەقیدە لە لای کەسی مورجیئە ئەوەیە دەڵێت هەر کەسێك یەك جار لە ژیانیدا بڵێت (لا إله إلا الله) لە بازنەی ئیسلام دەرناچێت مەگەر هەڵوەشێنەرەوەیەك ئەنجام بدات، وە لە هەڵوەشێنەرەوەکەشدا بە حەڵاڵ زانینی لە دڵەوە کردوویانەتە مەرج پاشان وتنی بە زمانی،

(١) المسد: ١

بەمەش هەنگاوەکانی تەکفیر لە لای مورجیئە ئەوەیە ئینسان بکەوێتە هەڵوەشێنەرەوەیەك و دوای ئەمەش ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە بە حەڵاڵ بزانێت لە دڵیدا، پاشانیش بە زمانی بیڵێت و ڕایبگەیەنێت: ئەی خەڵکینە من کەوتوومەتە نێو ئەم کوفرە وە من ئەم کوفرە بە حەڵاڵ دەزانم، دەڵێت ئەو کاتە حوکم دەدەین بەسەر ئەم ئینسانە کە کافرە، جگە لەم سێ هەنگاوە حوکم نادات بەسەر هیچ کەسێك کە دەرچووە لە دین هەرچەندە هەرچییەکی کردبێت لە کار و کردەوەکان، جا بەپێی ئەم عەقیدە پوچەڵە ئەو دەسەڵاتدارانە بە موسڵمان لە قەڵەم دەدەن، وە هەتا موسڵمان بن و هەروەها حوکمی موسڵمانانیش دەکەن، دەڵێت: ئەوانە پێشەوا و سەرکردەن و گوێڕایەڵی کردنیان واجبە، بۆیە ئەم وەسفە مورجیئەییە بۆ ئەو دەسەڵاتدارانە پێچەوانە و سەرپێچی فەرموودەی الله عز وجل دەکات لە پەڕتوکی الله تعالی کە ناوی ناون تاغوتەکان -پەنا بە الله- وە تاغوتیش ناکرێت ببێتە پێشەوای موسڵمانان ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئەمە بابەتی یەکەم.

بابەتی دووەم، ئەگەر وتمان لە ڕێگەی پەڕتوکی پەروەردگارمان کە ئەو دەسەڵاتدارانە -بەبێ جیاکردنەوە براکانم- هەموویان ناوی شەرعی بۆیان تاغوتە، ئەگەر زمانت لێ ڕانەهێنیت لەسەر ئەم وشەیە و گوێچکەکانیشت، شتێك لە ناوەوەت دەمێنێتەوە بۆیە پێویستە زاراوە شەرعییەکان بەکاربهێنیت تاوەکو بوەستیت لە لای سنووری الله عز وجل، چونکە کاتێك دەربارەی ئەم حکومەتە دەڵێم حکومەتێکی تاغوتی، نابێت لە ناوەوەمدا شتێك لە سۆز و خۆشەویستی هەبێت بۆ ئەوانە.

بابەتی دووەم، کاتێك وتمان ئەوانە تاغوتن ئایا پێویستیان بە چەسپاندنی بەڵگە هەیە تاوەکو پێیان بڵێین تاغوت؟ هەروەك ئەمە نەریتی مورجیئەیە، پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم: ئەو دەسەڵاتدارانە ئەوانەی حوکم دەکەن بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە و ناوی شەرعیشیان تاغوتە دابەش دەبن بۆ دوو بەش یان ئەوەتا کافری ئەسڵیین وەك ئەو دەسەڵاتدارانەی حوکمی وڵاتانی ڕۆژئاوا دەکەن، ئەو تاغوتانە کافری ئەسڵیین، وە یان تاغوتی هەڵگەڕاوەن لە دینی الله عز وجل وەك ئەو دەسەڵاتدارانەی حوکمی وڵاتانی موسڵمانان دەکەن، ئەوانە ئەگەر بمانەوێت ناویان بنێین هەروەك الله عز وجل ناوی لێنان، ئایا مەرجە بەڵگەیان لەسەر بچەسپێنین بەرلەوەی ئەم ناوەیان بۆ بەکاربهێنین؟ یەکەم: پێویست ناکات بەڵگەیان لەسەر بچەسپێنین -ئێستا قسەم دەربارەی تاغوتە مورتەدەکانە- پێویست ناکات بەڵگەیان لەسەر بچەسپێنین تاوەکو ناویان بنێین تاغوت، بەڵگە چییە؟ الله تعالی لە پەڕتوکەکەیدا لەبارەی پێغەمبەر موسا دەفەرموێت ﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ١٧﴾[1] ئەم فەرمانە لە الله ـەوە -عز وجل- دەرچوو بۆ پێغەمبەر موسا لە کاتی گەڕانەوەی لە مەدیەن، لە ناوچەی سینا الله عز وجل وەحی بۆ کرد بەم ئایەتە (ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ) ئێستا ئەو لە سینایە فیرعەونیش لە میصر، کەوایە هێشتاکە نەگەیشتووەتە لای، موسا (عليه السلام) هێشتا نەگەیشتووەتە میصر و نەگەیشتووەتە لای ئەو لەگەڵ ئەمەشدا الله عز وجل ناوی برد

(١)النازعات: ١٧

بە تاغوت (ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ) -واتە سنووری بەزاندووە- جا ئەو کە سنووری بەزاندووە و یاخی بووە، ئەمە فیعلە ناوەکەشی تاغوتە، کەوایە فیرعەون تاغوتە، بۆیە الله تعالی ناوی فیرعەونی میصڕی برد بە تاغوت پێش ئەوەی پێغەمبەر موسا بچێتە لای؛ چونکە ئەم فەرمانە هەروەك بۆم باسکردی لە سینایە، وە فیرعەونی میصڕیش لە میصڕە هێشتاکە پێی نەگەیشتووە، بۆیە هێشتا بەڵگە نەچەسپابوو لەسەر فیرعەون لەگەڵ ئەمەشدا الله عز وجل ناوی برد بە تاغوت، جا ئەگەر ئەمە لە دەربارەی کافری ئەسڵی بێت کە پێویست ناکات بەڵگە بچەسپێنین هەتا پێی بڵێین تاغوت، ئەی چی دەڵێی بە موڕتەدێك کە هەڵگەڕاوەتەوە لە دینی الله عز وجل و بووەتە تاغوت، بۆیە لە پێشترە کە پێویست نەکات بە چەسپاندنی بەڵگە چونکە پێغەمبەر (ﷺ)کاتێك هێرشی دەکردە سەر وڵاتەکانی کافران -بەتایبەت لە شەودا- چاوەڕوانی بەیانی دەکرد جا ئەگەر گوێی لە بانگ بووایە ڕووی وەردەگێڕا و دەڕۆیشت، ئەگەریش گوێی لە بانگ نەبووایە ئەوا هێرشی دەکردە سەر و فەتحی دەکرد چونکە بانگدان نیشانەیەك بوو لە نیشانەکانی موسڵمانان، بۆیە بانگدان نەبووایە هێرشی دەکردە سەریان بۆچی؟ چونکە بەڵگە چەسپابوو لەسەریان بە پەیامی رسول الله (ﷺ)، کەوایە ئەوانە لە ناونانیان بە تاغوت -بەتایبەت موڕتەدەکانیان- پێویست بە چەسپاندنی بەڵگە ناکات ئەمە بەڵگەی یەکەم.

سەبارەت بە بەڵگەی تر، ئایا ئەوانە چی نازانن لەبارەی دین هەتا بەڵگەیان لەسەر بچەسپێنین؟ ئایا نازانن کە الله عز وجل پەڕتوکێکی دابەزاندووە بەناوی قورئان؟ ئایا نازانن الله تعالی پێغەمبەرێکی ناردووە ناوی محمدی کوڕی عبد الله یە؟ بەدڵنیاییەوە هیچ یەکێك لەو دەسەڵاتدارانە نەزان نین بە هیچ شتێك لەمانە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر یەکێکیان بیەوێت کەمێك خۆی بەگەورە و فیز دەربخات لە کەناڵە ئاسمانیەکان دەبینی دانیشتووە و دەست دەکات بە قورئان خوێندن، کەوایە ئەو باوەڕی وایە یاخود دەزانێت الله عز وجل ئەم پەڕتوکەی دابەزاندووە، ئێمە بینیمان ئەوەی کە حوکمی عێراقی دەکرد چۆن دەیخوێندەوە و بینیمان قەزافی چۆن دەیخوێندەوە و بینیمان فڵان چۆن دەیخوێندەوە، وە کۆیلەی ئەمریکییەکان چۆن دەیخوێندەوە و کۆیلەی ئینگلیز چۆن دەیخوێندەوە، بەڵکو موعەممەر قەزافی لەوانە بوو کە ئیجتیهادی دەکرد لە پەڕتوکی الله عز وجل، دەیوت سوڕەتی (الإخلاص) دەست پێدەکات بە: الله أحد، الله الصمد، لم يلد ولم يلد، چۆن؟ دەڵێت چونکە وشەی "قل"ئەمە وتەی جبريل ـە بۆ محمد و وتەی الله عز وجل نیە، بۆیە ئەم پیاوە بە تەنها ئەوەندەی نەدەزانی کە پەڕتوکێك هەیە ناوی قورئان، بەڵکو ئیجتیهادی دەکرد لە پەڕتوکی الله عز وجل، جا ئەوانە ئەم شتەیان دەزانی، شتی دووەم: ئایا ئەو دەسەڵاتدارانە نازانن کە پێغەمبەر (ﷺ)حوکمی کردووە بەم حوکمانە لە ماوەی ژیانیدا پاشان حوکمەکەی جێهێشتووە بۆ ئەوانەی دوای خۆی کە خەلیفە ڕاشیدەکانن، پاشان دوای ئەوە ئەو خەلیفانەی هاتن لەدوای ئەوان؟ ئایا ئەمە بابەتێکی مێژووییە کە شاراوە بێت لەوانە و بابەتەکەش هەزار و چوار سەد ساڵە درێژبووەتەوە و هەیە، واتە بابەتەکە حەصر نەکراوە لە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ

هەتا بڵێین باسەکە شاراوە بووە لە فڵان و نەیزانیوە، نەخێر بابەتەکە هەزار و چوار سەد ساڵە هەیە، وە هەموو ئەو خەلیفانە حوکمیان کردووە بەم حوکمانەی لە پەڕتوکی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی دا هەیە، ئەوانە نەزانین نین بەم بابەتە بەتایبەت، ئایا ئەوانە نازانن کە پایتەختی خیلافەتی ئیسلامی لە (یثرب) لە مەدینەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو پاشان دوای ئەوە لە کوفە و دوای ئەوە لە دیمەشق و دوای ئەوە لە بەغداد و دوای ئەوە لە قوڕتوبە، ئایا ئەم بابەتانە شاراوەیە لەوانە؟ بەدڵنیاییەوە دەزانن کە ئەو خەلیفانەی حوکمیان دەکرد لەو پایتەختانە ئەوا حوکمیان دەکرد لە ڕێگەی ئەم پەڕتوکە و لە ڕێگەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، ئایا شاراوەیە لەوانە بابەتە دیارەکان کە شاراوە نیە لە بچووکەکانی موسڵمانان -لە منداڵانی موسڵمانان-؟ کێ لە موسڵمانان نازانێت ئارەق حەرامە؟ کێ لە موسڵمانان نازانێت زینا حەرامە؟ کێ لە موسڵمانان نازانێت ڕیبا حەرامە؟ مەگەر ئەو بابەتە دیار و ئاشکرایانە شاراوەیە لەوانە و حکومەتەکانیان کە دامەزراوە لەسەر ئارەق و لەسەر زینا و لەسەر ڕیبا؟ مەگەر نازانن ئەوانە حوکمەکانی الله ـیە -عز وجل-؟ ئەی مورسی هەموو پەڕتوکی الله تعالی ـی لەبەرنەبوو کاتێك چوار ملیار و نیوی قەرز کرد لە بانکی نێودەوڵەتی هەمووی بە ڕیبا؟ ئایا بەڵگەی لەسەر بچەسپێنم لە کاتێکدا پەڕتوکی الله ـی لەبەرە؟ هەروەها ئەوانی تریش، ئایا لەوانە شاراوەیە کە هەندێك حوکم هەیە بۆ هەندێك لەو سنوورانەی الله عز وجل دایناوە؟ ئایا نازانن ئەوەی زینا بکات ئەگەر مەرجەکانی زیناکردنی لێ هاتە دی، ئەوا ڕەجم دەکرێت ئەگەر خێزاندار بێت و جەڵدەی لێ دەدرێت ئەگەر ڕەبەن بوو و خێزاندار نەبوو؟ مەگەر نازانن دز ئەگەر مەرجەکانی دزی کردنی لێ بێتە دی دەستی دەبڕدرێت؟ مەگەر ئەوانە ئەم حوکمانە نازانن هەتا دوای ئەوە مورجیئەیەك بێت و بڵێت ناتوانین پێی بڵێین تاغوت تەنها دوای چەسپاندنی بەڵگە نەبێت، ئەمە قسەی مورجیئەیە بەڵکو ڕاست و دروست لە وتەکەدا ئەوەیە کە کافری ئەسڵی پێویست بە چەسپاندنی بەڵگە ناکات، بۆیە لە پێشترە کە هەڵگەڕاوە (مورتەد) لە دینی الله عز وجل پێویست بە چەسپاندنی بەڵگە نەکات بۆی بەڵکو ئەوان تاغوتن، ئەمە بەڵگەیەکی تر بوو.

بەڵگەی سێیەم: براکانم ئەو تاغوتانە هەر تەنها ئیسلام ناناسن بەڵکو فیرقە و کۆمەڵەکانی ئیسلامیش دەناسن، هەر بۆیە دەیانبینی سۆزیان هەیە لەگەڵ سۆفیەت، دەبینی سۆزیان هەیە بۆ حیزبی عێراقی، دەبینی سۆزیان هەیە بۆ مورجیئە، وە کاتێك مەسەلەکە بگاتە لای ئەهلی سوننە ئەوا کەسی دانیشتوو و موجاهید لەوان لە یەکتر جیا دەکەنەوە، ئایا ئەمە پێویستی بەوەیە بەڵگەی لەسەر بچەسپێنیت هەتا پێی بڵێی تاغوت؟ مەگەر بیرتان نیە لە سەردەمی بەعسییەکان کە ڕیش هێشتنەوە ئەگەر لە ڕووخساری مورجیئەیەك بووایە ڕێگە پێدراو بوو بەڵام ئەگەر لە ڕووخساری یەکێکی تر بووایە ڕێگە پێدراو نەبوو! باشە، چۆن ئەمە و ئەوەیان جیا کردەوە؟ کە ئەمە موسڵمانە -لە حیسابی خۆیان- و ئەوی تریش موسڵمانە، بۆچی مورجیئە ڕێگەی پێدرابوو ڕیشی بهێڵێتەوە کەچی ئەوی تر دەهێنرایە بارەگاکان و داوای وەڵامی لێ دەکرا تەنانەت هەڕەشەی لێ دەکرا ئەگەر ڕیشەکەی نەتاشیبوایە؟ چۆن جیاوازیان

کرد لە نێوان ئەمە و ئەوە؟ بۆیە ئەوان هەر تەنها ئیسلام ناناسن بەڵکو فیرقەکانی ئیسلامیش دەناسن، وە دەزانن شوێنی توندبوون لەسەریان لە کوێدایە و شوێنی نەرمی نواندنیش لە کوێدایە، وە ئێوە دەزانن لە سەردەمی بەعسییەکان ئەوانەی مینبەرەکانیان وەردەگرت و مزگەوتەکانیان وەردەگرت بریتی بوون لە سۆفیەکان، وە یەکێکیان ئەگەر جێگیر بوایە لەسەری کە وەهابییە ئەوا ڕاستەوخۆ لادەبردرا و وتاربێژێکیان دەهێنا لەو پەیانگایەی تەخەروجیان لێی دەکرد لەو کاتدا، کەوایە ئەمە ئەو دەسەڵاتدارانەن کە فیرقەکانی موسڵمانان دەناسن کە کامەیان زیانی پێدەگەیەنێت و کامەیان زیانی پێناگەیەنێت، پاشان دوای ئەوە دێی دەڵێی بەڵگەی لەسەر جێگیر دەکەم هەتا ناوی بنێم تاغوت! بەڵکو ئەو شتانێك لە دین دەزانێت کە تۆ نایزانیت، بۆیە ئەوانە پێویستیان بە چەسپاندنی بەڵگە نیە لە ناونانیان بە تاغوت.

لە پاڵ ئەمەدا دەڵێم بیرت نەچێت کە ناوەکانیان ناوی ئیسلامیین و لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی و لە ژینگەیەکی ئیسلامی ژیاون، وە لە خێزانێك -والله حسیبهم- حاڵی ئەو خەڵکە نازانین بەڵام بەدڵنیاییەوە هەموو دەدرێنە پاڵ ئیسلام، وە بەدڵنیاییەوە ئەو ناوچەیەی تیایدان تاوەکو دەگاتە کورسی دەسەڵات دەزانن کە مزگەوت هەیە و نوێژەکان هەیە و وتار هەیە و شتانێك هەیە لە دینی الله عز وجل، هەموو ئەو شتانە دەزانن، وە بیرت نەچێت کە ئەوانە لە مامەڵەکردنی کەلوپەل دا نین لە بابەتەکانی دونیا بەڵکو ئەوان کەسانێکن حوکمڕانی ملیۆنێك لە خەڵکی دەکەن، بۆیە کەسانێکی ئاسایی نین -واتە نموونەی ئەوانە- بەڵگەیان لەسەر بچەسپێنرێت هەتا ناویان بنێین تاغوت یان ناویان نەنێین، کەوایە پێویست بە چەسپاندنی بەڵگە ناکات لەسەر ئەوانە بەڵکو ئەوان تاغوتن هەروەك الله عز وجل ناوی لێناون.

تەبعەن ئەم بابەتە دەچێتە نێو بابەتی ناوەکان و حوکمەکان؛ چونکە حوکمەکانی شەرع دابەش دەبێت لە چوارچێوەی سێ بەش: بابەتەکانی شیرکی گەورە، بابەتە دیارەکان، وە بابەتە شاراوەکان، لە بابەتەکانی شیرکی گەورە و بابەتە دیارەکان بەڵگە بە هەندێك مەرج دەچەسپێنرێت، بەڵام لە بابەتە شاراوەکان بەڵگە بە مەرجی تر دەچەسپێنرێت، ڕوونە إن شاء الله.. باشە.

بابەتی سێیەم: پێویستە چی بزانیت دەربارەی ئەو تاغوتە هەڵگەڕاوانە لە دینی الله عز وجل؟

ڕاستی یەکەم کە پێویستە بیزانین ئەوەیە کە دینی ئەندامانی ئەم حکومەتانە قانون و دەستورە نەك ئیسلام، دینی ئەم حکومەتانە قانون و دەستورە نەك ئیسلام هەرچەندە بانگەشەی ئەوە بکات کە موسڵمانە، هەرچەندە پێی وابێت موسڵمانە، بەڵکو لە ڕاستیدا دینی ئەو دەسەڵاتدارانە -بە هەموو ئەو پێکهاتانەی باسم کرد- دینی ئەوانە دەستور و قانونە، بەڵگە چییە؟ بیرتانە کاتێك قسەمان کرد دەربارەی دەستور وتمان ئەم قانون و دەستورانە دینە، وە ئەم وتەیەی الله تعالى ـمان کردە بەڵگە﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ ... ﴿٢١﴾﴾[1]، وە وتمان لێرەدا دین دابەش دەبێت بۆ دینی الله

(١) الشورى: ٢١

﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ٨٣﴾[(١)]، وە دینی پاشا﴿مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ ٧٦﴾[(٢)]، کەواتە دین بریتییە لە دوو دین: یان دینی الله عز وجل یان دینی پاشا، ئەو کەسانە ئەوانەی ئێستا حوکمی بەندەکان و وڵاتەکان دەکەن حوکم دەکەن بە دینی پاشا نەك دینی الله عز وجل، دینی الله ئاشکرا و ڕوونە، پەکخراوە و خراوەتە لایەك، بەڵام دینی پاشا باڵادەستە و زاڵە بەسەر وڵاتان و بەسەر بەندەکان، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەڵێم -برای بەڕێزم- کە دینی ئەو تاغوتانە قانون و دەستورە نەك ئیسلام.

ئایا دەکرێت بەیەکەوە کۆبکەینەوە و بڵێین دینیان ئیسلامە دینی حەقە -واتە شتێکیان تیادایە لە ئیسلام بەپێی ئەوەی کە بەڕۆژوو دەبێت و نوێژ دەکات و حەج دەکات و عومرە دەکات و هاوشێوەی ئەمانە- وە لە پاڵ ئەم دینە حەقە شتێکی تیادایە لە دینی باتڵ-واتە کۆیکردووەتەوە لە نێوان دینی الله و دینی پاشا-؟ بە هیچ شێوەیەك ناکرێت دینی الله عز وجل لەگەڵ دینی پاشا کۆ بکرێنەوە لە یەك ئینساندا، ئەم کارە مەحاڵە چونکە پێشتر ئاماژەمان دا بۆ ئایەتێك، ئایەتی پیرۆزی ﴿وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ١٥٠﴾[(٣)]الله عز وجل فەرمووی﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗا ١٥١﴾[(٤)]وە پێشتر باسی ڕێسایەکمان کرد لە بابەتی ئیسلام لەگەڵ شیرك و وتمان: "ئیسلام و شیرك دوو دژیەکن و کۆ نابنەوە، وە دوو دژیەکی هەڵوەشێنەرەوە کۆ نابنەوە و بەرزیش نابنەوە" بۆیە ناکرێت ئینسان لەسەر دوو دین بێت لە یەك کاتدا، کاتێك دینی حەقمان -دینی ئیسلام- چەسپاند ئەوا دینی باتڵی پاشا بەرز دەبێتەوە و لادەچێت، بەڵام ئەگەر دینی باتڵی پاشامان چەسپاند بەدڵنیاییەوە دینی الله -ئیسلام- بەرز دەبێتەوە کە دینی حەقە، ناکرێت لە یەك ئینساندا دوو دین کۆ ببنەوە، کەوایە هەتاوەکو ئەوانە دینیان دەستور و قانون بێت چونکە حوکم دەکەن بەم قانونانە، کەواتە ناکرێت بڵێین ئەوانە دینیان ئیسلامە چونکە ئەگەر دینیان ئیسلام بووایە ئەوا حوکمیان دەکرد بەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە، ئەمە ڕاستی یەکەم کە پێویستە بیزانیت دەربارەی ئەم تاغوتانە.

ڕاستی دووەم: ئەوەیە کە پەرستراو و خوای ئەم حکومەتە تاغوتیە مورتەدانە بریتییە لە لیژنەی نووسینەوەی دەستور، پەرستراویان لیژنەی نووسینەوەی دەستورە، بەڵگە چییە؟ لە بیرتانە کاتێك قسەمان کرد دەربارەی فەرموودەی الله عز وجل:﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ٤٩ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ٥٠﴾[(٥)]، وە باسی ئایەتێکی ترمان کرد ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ

---

(١)آل عمران: ٨٣

(٢) يوسف: ٧٦

(٣)النساء: ١٥١

(٤) النساء: ١٥١

(٥) المائدة: ٤٩ ، ٥٠

﴿أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾﴾[1] ئەو کاتە وتمان ئەمانە حوکمانێکی جاهیلیین، بەڵام بیرت نەچێت کە ئێمە وتمان جوولەکە -زانایانی جوولەکە- کاتێك شەریعەتی پێغەمبەر موسا یان گۆڕی، وە زانایانی نەساڕا کاتێك شەریعەتی پێغەمبەر عیسا یان گۆڕی، وە جوولەکە و نەساڕاکانیش گوێڕایەڵی زاناکانیان کرد، ئەوا زاناکانیان بوونە پەرستراو و خوا لەبری الله بە دەقی ئایەتی (ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾ ) باشە، کەسانێك قانون دادەنێن، وە ئەم حکومەتانە گوێڕایەڵی ئەوانە -لیژنەی نووسینەوەی دەستور- دەکەن لەو دینەی دایانناوە، دینێکی باتڵ هەیە -دینی پاشا- دانەرەکەی لیژنەی نووسینەوەی دەستورە، ئەم حکومەتانەش گوێڕایەڵی لیژنەی نووسینەوەی دەستور دەکەن بەم دینە دانراوە، بۆیە لە ئەنجامدا پێویستە بڵێین دینەکەیان قانون و دەستورە، کەواتە بەپێویستییەوە پەرستراوی ئەوان بریتییە لە دانەری ئەم دینە و دانەری ئەم قانونە و دانەری ئەم دەستورە، کە ئەوانیش لیژنەی نووسینەوەی دەستورن، واتە بابەتەکە لەمە دەچێت: جوولەکە و نەسارا، لە لایەکی ترەوە حکومەتێکی تاغوتی، زانایانی جوولەکە و زانایانی نەساڕا گۆڕانکاریان کرد، لیژنەی نووسینەوەی دەستور گۆڕانکاریان کرد، جوولەکە و نەساڕا گوێڕایەڵیان کرد، ئەم حکومەتانەش گوێڕایەڵیان کرد، ڕووی لێکچوون: سەد لە سەدە، ئەو جوولەکانە الله عز وجل ناوی نان فەرمووی ئێوە ئێستا حاخامەکان و قەشەکانتان کردووەتە پەستراو و خوا، بۆچی؟ چونکە گوێڕایەڵی زاناکانیان کرد لە شەریعەتە گۆڕدراوەکە، ئەو تاغوتانەش گوێڕایەڵی لیژنەی نووسینەوەی دەستوریان کردووە لە قانون و دەستور کە گۆڕدراو و جێگرەوەیە بۆ شەرعی الله عز وجل، بۆیە یەکسانن ئەوان و جوولەکە لەم حوکمەدا، إن شاء الله توانیومە فیکرەکە بگەیەنم؟ (ئامادەبووان) : إن شاء الله بارك الله فيك.

بەڵکو ئەوانە خراپتریشن لە جوولەکە و لە نەساڕا، ئەم حکومەتە تاغوتییە موڕتەدانە زۆریش خراپترن لە جوولەکە و لە حاخامەکانی جوولەکە و لە قەشەکانی نەساڕا، چۆن؟ ئەوان -زاناکانی جوولەکە و زاناکانی نەساڕا- کاتێك جێگرەوەکانیان هێنا بۆ تەشریع خەڵکیان پابەند نەکرد بە هێز هەتا ملکەچ ببن بۆ ئەم تەشریعە جێگرەوەیەی هێنابوویان، بەڵام ئەو تاغوتانە زۆر خراپترن لە جوولەکە و نەساڕا و لە زاناکانیان؛ چونکە ئێستا موسڵمانان ناچار دەکەن لەڕێگەی هێز بۆ ئەوەی ملکەچ ببن بۆ ئەم دینە باتڵە -دینی پاشا- کەوایە ئەوان حاڵیان خراپترە لەم لایەنەوە.

خراپترن لە لایەنێکی ترەوە: زانایانی جوولەکە و زانایانی نەساڕا کاتێك گۆرانکارییان کرد چاودێری جوولەکە و نەساڕایان نەدەکرد کە ئایا پابەند دەبن بە دینەکەیان یاخود پابەند دەبن بەو تەشریعە جێگرەوەیەی هێنابوویان، لە لای ئەوان لیژنەی چاودێری و لیژنەی بەدواداچوون بۆ کاروباری خەڵك نەبوو کە ئایا خەڵکی پابەند دەبن بە تەشریعە جێگرەوەکە یان نا، بەڵام ئەم حکومەتە تاغوتیانە بۆ هەر

(١)التوبة: ٣١

کوێیەك دەچیت چاودێرێکیان داناوە بەسەر خەڵکیەوە، ئایا لێرەدا سەرپێچی قانونت کرد یان نا، وە ئاشکرایە کە لە دەسەڵاتەکانی پەرلەمان -ئەندامانی پەرلەمان- لە دەسەڵات و توانایاندایە لێپرسینەوە بکەن لەگەڵ وەزیرەکان ئەگەر سەرپێچی شتێکیان لە دەستور یان قانون کرد، هەر بۆیەش دەبینی هەندێك حیزب ئەگەر فڵانە ئیمزایان بکەوتایەتە دەست بۆ بانگهێشت کردنی فڵانە وەزیر، بانگهێشت دەکرا و داوای وەڵامی لێ دەکرا لەبەردەم پەرلەمان کە تۆ سەرپێچی فڵانە ماددەت لە قانون کردووە، وە سەرپێچی فڵانە دەقت لە دەستور کردووە، کەوایە ئەوانە خەڵك ناچار دەکەن بە هێز بۆ ملکەچ بوون بۆ ئەم دینە باتڵە -دینی پاشا-، پاشان جاسوسیان داناوە و کەسانێکیان داناوە چاودێری و بەدواداچوونی ئەوانە دەکەن کە سەرپێچی ئەم قانونە دەکەن، جا ئەگەر کەسێکیان بینی سەرپێچی دەکات ئەوا ناچاری دەکەن بە هێز بەوەی گوێڕایەڵی بکات، کەوایە لێرەوە حاڵیان خراپترە لە زانایانی جوولەکە ولە زانایانی نەسارا.

وە لەوان خراپترن لە لایەنی سێیەمەوە: بەوەی ئەوان سزایان داناوە بۆ ئەوانەی سەرپێچی دەکەن، هەر ئینسانێك سەرپێچی قانون یان دەستور بکات سزا دەدرێت بەپێی قانون و بەپێی دەستور، نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە: ئەگەر یەکێکیان بوێرێت و دەست بکات بە دروستکردنی ئارەق لە ماڵەکەی، ئایا دەزانی ئەو کەسە سزا دەدرێت لە ڕووی قانونییەوە؟ نەك لەبەرئەوەی دروستکردنی ئارەق حەڕامە، بەڵکو لەبەرئەوەی شتێکی دروستکردووە بەبێ مۆڵەتی قانون، ئەمە سەرپێچییێکی قانونیە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت، لە ناوچەکەمان پیاوێك هەبوو ئارەقی دروست دەکرد و لە هەر ماوەیەك لەگەڵ پۆلیس دەبینرا کە دەیانبرد بۆ بنکە، بۆچی؟ چونکە هەڵیانکوتایە سەر ماڵەکەی و ئارەقیان بینی، وتیان: تۆ هیچ مۆڵەتێکت نیە، وە تۆ ئارەق دروست دەکەیت و قانونیش سزات دەدات لەسەر ئەمە، بۆیە پیاوەکە زیندانی دەکرا، کەوایە لە ڕێگەی هێز خەڵك ناچار دەکەن لەسەر ملکەچ بوون بۆ ئەم دینە باتڵە، پاشان دوای ئەمە جاسوس دادەنێن بۆ چاودێری کردنی ئەوانەی سەرپێچی دەکەن، پاشان سزاکانیان دانا بۆ ئەوانەی سەرپێچی دەکەن، بۆیە بەدڵنیاییەوە حاڵیان خراپترە لە حاخامەکان و لە قەشەکان، وە حاڵیان خراپترە لە جوولەکە لە گوێڕایەڵی کردنیان بۆ زاناکانیان، ئەمە پێویستە موسڵمان بیزانێت دەربارەی ئەم حکومەتە تاغوتیانە.

بابەتی سێیەم کە پێویستە بیزانیت دەربارەی ئەم حکومەتە تاغوتییە موڕتەدانە: براکانم کوشتاری ئەوانە واجبە لەسەر من و تۆ بە فەرمانی الله عز وجل، ئایەتێك هەیە پێشتر زیاتر لە جارێك بە بەڵگە هێنامانەوە لە سوڕەتی (البقرة - ١٩٣) و لە سوڕەتی (الأنفال) کە ئەوەی سوڕەتی (الأنفال)ـم باس کرد ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ ئەوانە هیچ شتێکیان وا لێنەکردووە بۆ الله بێت، وە ئەگەر ئەوان هەموو شتێك وا لێبکەن بۆ الله بێت و تەنها یەك شت بۆ جگە لە الله بێت، تۆ فەرمانت پێکراوە بە فەرمانی الله کە بجەنگیت لەگەڵ ئەو

کەسانە، جا چی بگات بەوەی هیچ شتێکیان وا لێنەکردووە بۆ الله عز وجل بێت، وە ئەوەی کردووشیانە گۆڕیویانە و خستویانەتە ژێر دەستور و ژێر ماددەکانی قانون، بۆیە ئەوان حوکم دەکەن بە دەستور و قانون -هەروەك پێشتر وتمان- و حوکم ناکەن بەناوی الله تعالی، هەر بۆیە دەیانبینی کاتێك بڕیارێك دەردەکەن لە پەرلەمان، هەرچەندە (إبراهيم نعمة) ئەو کەسەی بەیاننامەکە دەخوێنێتەوە ناتوانێت بڵێت (بسم الله الرحمن الرحيم) بەڵکو دەڵێت: بەناوی گەل! چونکە حوکمەکان دەردەچن بەناوی گەل، لە جیاتی ئەوان چونکە ئەوانە نوێنەرایەتی گەل دەکەن و حوکمی خەڵك دەکەن بەناوی گەل، بۆیە کاتێك قانونێك یان تەشریعێك دەخوێنێتەوە بەناوی الله دەست پێناکات تەنانەت ئەگەر یەکبگرێتەوەش لەگەڵ شەرعی الله، بەڵکو ناوی گەلی لێ دەهێنێت، کەوایە کوشتاری ئەوانە کاتێك زانیت کە دینەکەیان دینی پاشایە -دەستور و قانون- وە کاتێك زانیت ئەوان لیژنەی نووسینەوەی دەستوریان کردووە بە خوا و پەرستراو، ئینجا بزانە الله عز وجل فەرمانی پێکردوویت بجەنگیت لەگەڵ ئەوانە هەتا دین هەمووی بۆ الله بێت، ڕازی نابین بەوەی شتێك لە حوکم بۆ جگە لە الله عز وجل بێت ئەگەرنا صەحابە بۆچی ئەو هەموو ئازار و ماندووبوونەیان دەکێشا هەتا ئەم دینە بگەیەنن بە ئێمە بە سانایی و ئاسانییەوە، کەچی دوای ئەوە دین وا لێ بکەین بۆ جگە لە الله عز وجل بێت و لە کاتێکدا ئێمە باوەڕمان بەم دینە هەیە! پەنا بە الله لەوەی کارەکە بەم شێوەیە بێت، بۆیە (وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ).

وە لەو شتانەی پێویستە بیزانیت دەربارەی ئەو تاغوتانە ئەوەیە کە ئەوان لە سوورترینی خەڵکن لەسەر دوورخستنەوەی موسڵمانان لە دینەکەیان، هیچ خەمێکیان نیە جگە لەوەی کار بکەن لەسەر دوورخستنەوەی موسڵمان لە دینەکەی، وە ئێوە لە بیرتانە لە سەردەمی بەعسییەکان ئەگەر گەنجێك هاتووچۆی مزگەوتی بکردایە، بەدوایەوە دەبوون لە لایەن هەواڵگری و لە لایەن ئاسایش و لە لایەن حیزب، پاشان دوای ئەوە ئەگەر ئەم موسڵمانە هەستی بەخۆی بکردایە و بیزانیایە کە بەدوایەوەن و چاودێری دەکەن بۆیە هەتا مەسەلەکە ون بێت ولەبەرچاو نەمێنێت، دەچوو بۆ گازینۆ و بۆ قاوەخانە، بۆ شتێك لێرە و بۆ شتێك لەوێ، جا ڕاپۆرتەکانی کۆتایی دەینوسی: ئەخلاقی باش بووە! ئیتر دوای ئەوە چاودێرییان نەدەکرد، ئەوەی ئێستا تاغوتەکان دەیکەن لە وڵاتانی موسڵمانان زۆر زیاتر و توندترە لەمە، ئایا دەزانی لە تونس ئەوەی بانگهێشت بکرایە یەکەم شت قاچەکانیان سەیر دەکرد بۆ ئەوەی ببینن کە ئایا هیچ شوێنەوارێکی سوجدە هەیە لە پێیەکانی یان لە قاچەکانی؛ چونکە موسڵمان کاتێك دادەنیشێت لەسەر قاچەکانی، شوێنەوارێك جێدەهێڵێت ئەمە شوێنەوارێکە لەسەر ئەوەی تۆ نوێژ دەکەیت ئەمە موسڵمان لەسەری دەگیرا لەو کاتدا، وە هەر کەسێك چرا و ڕووناکی بکردبایەوە لە کاتی سپێدە مانای ئەوە بوو ئەم ماڵە نوێژی بەیانی دەکەن، چاودێری دەکرا، بۆیە لە پاڵ بڵاوکردنەوەی فەساد پەنا بە الله، تاکە خەمیان ئەوەیە چۆن کار بکەن لەسەر دوورخستنەوەی موسڵمانان لە دینەکەیان، چونکە دەزانن ئەم

کورسیە تاغوتییە هیچ دەستێکی بە خراپە بۆ نابردرێت تەنها لە لایەن موسڵمانانەوە نەبێت بەمەش پێویستە موسڵمان لەسەر دینەکەی نەبێت، بەڵکو بەم جۆرە لێی ڕازی دەبن کە ئینسانێکی ئاشتیخواز بێت هەروەك ئیخوانی میصرٍ و هەروەك حیزبی عێراقی وایان دەوێت، ئینسانێکی ئاشتیخواز و دووربکەوێتەوە لە توندوتیژی و هەر لە بنەڕەتەوە باوەڕی پێنەبێت کاتی جیهاد نیە، ئەم جۆرە لە موسڵمان ئەوان بە باش و چاکی دەزانن و بەڵکو خۆشیان لێی نزیك دەکەنەوە، ئەمە بابەتانێکە پێویستە موسڵمان بیانزانێت دەربارەی ئەو تاغوتانە، سەبارەت بە وانەی داهاتوو -إن شاء الله تعالى- قسە دەکەین دەربارەی ئەوەی چی پێویستە لەسەرت بەرامبەر ئەو تاغوتانە، أقول قولي هذا وجزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وتاری**

**شێخ ئەبی عەلی ئەنباری** -تقبه الله-

**بەناونیشانی**

**جێبەجێکەرانی دەستور**

**وەرگێڕانی**

**پێگەی ڕاستەڕێ**

